# سێ بنچینەکە وبەڵگەکانی

الأصول الثلاثة وأدلتها

نوسینی پێشەوا
محمدی کوڕی عبدالوهاب

وەرگێڕانی
عثمان أحمد

ربيع الأول 1441هـ

چاپی یەکەم

# سێ بنچینەکە وبەڵگەکــانی

## الْأُصُولُ الثَّلَاثَةُ وَأَدِلَّتُهَا

نوسینی پێشەوا
محمدی کوڕی عبدالوهاب

وەرگێڕانی
عثمان أحمد حاتم

ربیع الأول ١٤٤١هـ

چاپی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحْمد للَّه ، نَحْمده ونستعينه ونستغفره ، ونعوذُ باللَّه من شُرور أَنْفُسنا من يَهْده اللّه فَلَا مضل لَه ، ومن يضْلل فلا هَادي لَه وأَشْهد أَنْ لا إلَه إلاّ اللَّه وحده لا شَرِيك لَه ، وأَشْهد أَنَّ مُحمَّدًا عبده ورسولَه .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾(آل عمران).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾(النساء).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ (الأحزاب).

أَمَّا بعد : فإنّ أَصْدَقَ الحَديث كتاب اللّه ، وخَير الهدي هَدْي محمَّد ﷺ وشرَّ الأُمور محْدَثاتُها ، وكلَّ مُحْدَثَة بدعةٌ ، وكلَّ بدعة ضَلالَةٌ ، وكلَّ ضَلالَة في النَّارِ .

بسم الله الرحمٰن الرحيم

اعلمْ رحمكَ اللهُ أنَّهُ يجبُ علينا تعلُّمُ أربعِ مسائلَ ؛

الأُولى : العلْمُ ؛ وهو معرفةُ اللهِ ، ومعرفةُ نبيِّهِ ، ومعرفةُ دينِ الإسلامِ بالأدلة .

الثانيةُ : العملُ به ،

الثالثةُ : الدعوةُ إليه

الرابعةُ : الصبرُ علَى الأَذى فيه .



به ناوی خودای میهرەبانی بە بەزەیی

بزانە بەڕەحمەتبیت ، پێویستە لەسەرمان چوار پرس فێربین ،

یەکەم : زانستە ، کە بریتییە لە ناسینی خودا ، وناسینی پێغەمبەرەکەی ، وناسینی ئاینی ئیسلامە بە بەڵگەوە.

دووەم : کردار پێکردنی .

سێیەم : بانگەواز بۆ کردنی .

چوارەم : ئارامگرتن لەسەر ئەو ناڕەحەتیانەی کە بە هۆی بانگەوازەوە دێتە ڕێ .

# سێ بنچینەکە وبەڵگەکانی ........... ٥

والدليل قولُه تعالَى : بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَٱلْعَصْرِ ١ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ٣﴾(العصر).

، قالَ الشافعيُّ رحمَهُ اللهُ تعالَى : لَوْ ما أَنْزَلَ اللهُ حجَّةً عَلَى خَلْقه إلاَّ هٰذه السُّورةَ لَكَفَتْهم .

وقال البخاريُّ رحمَهُ اللهُ تعالى : بابُ العلمِ قبلَ القولِ والعملِ ،

✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻

بەڵگە لەسەر ئەوە خودای پەروەردگار دەفەرموێت : بە ناوی خودای میهرەبانی بە بەزەیی ، سوێند بە کات ، بە دڵنیاییەوە مرۆڤ لە دۆڕاندایە ، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە باوەڕیان بە خودا هێناوە وکردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن ، وئامۆژگاری یەکتر دەکەن بە حەق وڕاستی ، وئارامگرتن لەسەری .

وپێشەوا بوخاری بە ڕەحمەت بێت دەفەرموێت : بابەتی فێربوون پێش وتە وکردارە ،

والدليل قوله تعالى : ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ١٩ ﴾ (محمد) ،

فبدأ بالعلمِ قبلِ القولِ والعملِ .

اعلمْ رحِمَكَ الله : أنَّهُ يجبُ على كلِّ مسلم ومسلمة تَعَلُّمُ هٰذه الثلاث مسائل والعمل بهنَّ :

الأولى : أنَّ الله خَلَقنا ورزَقَنا ولم يترُكْنا هملاً ؛ بل أرسل إلينا رسولاً فمنْ أطاعَهُ



بەڵگەش لەسەر ئەوە خودای پەروەردگارە دەفەرموێت : بزانە کە هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە خودا ، لەبەر ئەوە داوای لێخۆشبوونی تاوانت بکە .

بە زانست دەستی پێکرد پێش گوتە وکردار .

بزانە بە ڕەحمەتبیت : پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێکی پیاو یان ژن ئەم سێ پرسە فێربێت وکردەوەیان پێبکات :

یەکەم : خودای پەروەردگار دروستیکردوین وڕۆزیمان دەدات ، وبەبێ چاودێریکردن وگرنگی پێدان ڕەهای نەکردووین ، بەڵکو پێغەمبەری بۆ ناردووین هەرکەس گوێڕایەڵی بکات

دخل الجنَّةَ ومن عصاهَ دخل النّار ، والدليل قولُه تعالى : ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ رَسُولٗا شَٰهِدًا عَلَيۡكُمۡ كَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ رَسُولٗا ١٥ فَعَصَىٰ فِرۡعَوۡنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذۡنَٰهُ أَخۡذٗا وَبِيلٗا ١٦ ﴾ (المزمل) .

الثانية: أنَّ اللهَ لا يرضى أن يُشْرك معهُ أحدٌ في عبادته لا مَلَكٌ مُقَرَّب ولا نبيٌّ مرسل ، والدليل قولُه تعالى :



دەچێتە بەهەشتەوە وهەرکەس سەرپێچی بکات دەچێتە ئاگرەوە ، بەڵگە خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ئێمە پێغەمبەرمان بۆ ڕەوانە کردوون کە گەواهیدەرە بەسەرتانەوە وەك چۆن پێغەمبەرمان بۆ فیرعەون ڕەوانە کرد ، فیرعەون سەرپێچی موسای پێغەمبەری کرد ، تۆڵەمان لێکردەوە وزۆر بە توندی سزاماندا .

دووەم : خودا ڕازی نابێت کەس لەگەڵیدا بکرێتە هاوەڵ لە پەرستنیدا نەهیچ فریشتەیەکی نزیك لە خودا ونەهیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراو ،بەڵگە خودای پەروەردگار دەفەرموێت :

﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ ﴾ (الجن) .

الثالثة : أنَّ مَنْ أطاعَ الرسولَ ووحَّدَ الله لا يجوزُ له موالاةُ من حادَّ الله ورسولَه ولو كان أقْرَبَ قريبٍ ، والدليل قوله تَعَالَىٰ : ﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ



ئەو ئەندامانەی جەستە کە سوژدەی پێدەبەن با تەنها لەبەر خودابێت وهیچ کەس مەکەنە هاوەڵی ولێیان مەپاڕێنەوە .

سێیەم : ئەو کەسەی گوێڕایەڵی پێغەمبەری خودا ﷺ دەکات وخودا بە تەنها دەپەرستێت دروست نییە بۆی دۆستایەتی لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکات کە دژایەتی خودا وپێغەمبەرەکەی دەکەن ، ئەگەرچی نزیکترین نزیکیانبن ، بەڵگە خودا دەفەرموێت : نابێت کەسانێك هەبێت باوەڕیان بە خودا وڕۆژی دوایی هەبێت دۆستایەتیان هەبێت لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دژایەتی خودا وپێغەمبەرەکەی دەکەن ئەگەرچی ئەو کەسانە باوکیان یان کوڕ یان



# سێ بنچینەکە وبەڵگەکانی ........... ٩



أَوۡ إِخۡوَٰنَهُمۡ أَوۡ عَشِيرَتَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم
بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ
رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ
ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٢٢ ﴾ (المجادلة).

**اعلَمْ أرشدَكَ الله لطاعته أنَّ الحنيفية : ملّةَ إبراهيمَ ، أنْ تعبدَ الله وحدَهَ**



**برایان یان لە عەشیرەتیانبن ، ئەو کەسانەی بەو شێوەیەن خودا باوەڕ لە دڵیاندا جێگیر دەکات وپاڵپشتیان لێدەکات وهێزیان پێدەبەخشێت ، ودەیانخاتە بەهەشتی پڕ لە باخی چڕ وپڕەوە کە ڕووباری ئاو بە ژێریاندا تێپەڕ دەبێت ، وبە هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە ، خودایان لێ ڕازیبووە ئەوانیش لە خودا ڕازین بە هۆی ئەو هەموو نازونیعمەتەی کە پێیبەخشیوون ، ئەوانە حیزبی خودان ، وتەنها ئەوانەی حیزبی خودان سەرفراز وسەرکەوتوون .**

**بزانە . خودا ڕێنمونیت بکات بۆ گوێڕایەڵی . کە حەنەفیەتی ئوممەتی پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام بریتییە لەوەی خودا بە تەنهای ودڵسۆزییەوە بپەرستیت**

مخلصًا له الدّين ، وبذلك أَمَرَ اللهُ جميعَ الناس وخلَقهم لها ، كما قال تعالى : ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦ ﴾ (الذاريات) ، ومعنى ﴿يَعْبُدُونِ﴾ يوحّدون ، وأعظم ما أَمَرَ اللهُ به التوحيدَ وهو: إفرادُ الله بالعبادة وأعظم مَا نَهَى عنهَ الشركُ ؛ وهو دعوةُ غيره معهُ ، والدليل قولهَ تعالى : ﴿ ۞وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ ۝٣٦ ﴾ (النساء) .



وكەس نەكەیتە هاوەڵی ، هەر ئەوەشە كە خودا فەرمانی بە هەموو خەڵك كردووە وبۆ ئەوەش دروستی كردوون ، وەك پەروەردگار دەفەرموێت : جن ومرۆڤم دروست نەكردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت كە من بپەرستن ، ومانای پەرستن بە تەنها پەرستن وهاوەڵبڕیارنەدانە ، گەورەترین شتێك كە خودا فەرمانی پێكردووە بە تەنها پەرستنی خودایە كە بریتییە لە : بە تەنها دانانی خودا لە پەرستندا وەگەورەترین شتێك كە نەهی لێكردووە هاوەڵبڕیاردانە كە بریتیە لە : پەرستنی كەسانی تر لەگەڵ خودا ، بەڵگەش ئەو فەرموودەی پەروەردگارە كە دەفەرموێت : خودا بپەرستن وهیچ شتێك مەكەنە هاوەڵی .

فَإذَا قيل لَكَ : مَا الأُصولُ الثلاثةُ التي يجبُ على الإنسان معرفتُها ؟ فقُل : معرِفةُ العبد ربَّهُ ، ودينَهُ ، ونبيَّهُ محمدًا صَلّى اللهُ عَلَيْه وسَلَّم .

فإذا قيل لك : من ربُّك ؟ فقل : ربيَّ اللهُ الذي رباني وربَّى جميعَ العالمينَ بنعمه ، وهو معبودي ليس لي معبودٌ سواهَ ، والدليل قوله تعالى : ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ﴾ (الفاتحة) ، وكلُّ ما سِوى الله عالَمٌ وأنا واحدٌ من ذلكَ العالَمِ .



ئەگەر پێت گوترا : ئەو سێ بنچینەیە چین کە پێویستە مرۆڤ بیانزانێت ؟ بڵێ : ناسینی خودا وئاینەکەی وپێغەمبەرەکەیەتی ﷺ .

ئەگەر پێت گوترا : کێ پەروەردگارتە : بڵێ : پەروەردگارم ئەو خودایەیە کە پەروەردەی کردووم وهەموو دروستکراوەکانی پەروەردەکردووە بە نیعمەتەکانی ، ئەوە پەرستراوی منە وجگە لە ئەو هیچ پەرستراوێکی ترم نییە ، بەڵگە خودای پەروەردگارە دەفەرموێت : سوپاس وستایش بۆ پەروەرگاری هەموو دروستکراوەکان ، وهەموو ئەوەی لە بووندا هەیە جگە لە خودا جیهانە ومنیش یەکێکم لەو جیهانە .

**فإذَا قيل لكَ : بمَ عرفْتَ ربَّك ؟ فقُل : بآياته ومخلوقاته ؛ ومنْ آياته الليلُ والنهارُ والشمس والقمرَ ، ومنْ مخلوقاته السمٰوات السَّبعُ والأَرْضُونَ السَّبعَ ومَنْ فيهنَّ وما بينهما ، والدليل قولُهُ تعالىٰ :** ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾(فصلت) ، **وقولُه تعالى :** ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ



**ئەگەر پێت وترا : بەچی پەروەردگارت ناسی ، بڵێ : بە ئایەتەکانی ودروستکراوەکانی ، ولە ئایەتەکانی شەو ورۆژ وخۆر ومانگە ، ولە دروستکراوەکانی حەوت چینەکەی ئاسمان وحەوت چینەکەی زەوی ، وئەوەی لە نێوانیاندایە ، بەڵگە خودا دەفەرموێت : لە ئایەتەکانی شەو ورۆژ وخۆر ومانگن ، سوژدە نەبۆ خۆر بەرن نەبۆ مانگ بەڵکو سوژدە بۆ ئەو خودایە ببەن کە دروستی کردوون ئەگەر ئێوە ئەو دەپەرستن ، وئەو فەرموودەی کە دەفەرموێت : بە دڵنیاییەوە پەروەردگاری ئێوە خودایە کە ئاسمانەکان وزەوی لە شەش ڕۆژدا دروستکردووە پاشان بەسەر عەرشدا بەرز وبڵند بووە ، ڕۆژ دەهێنێت بەسەر شەودا**

يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾(الأعراف).

**والرَّبُّ هو المعبودَ ، والدليل قولُه تعالى :** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾﴾(البقرة) ،



**وبەدوای یەکدادێن ، وخۆر ومانگ وئەستێرەکان ژێربار وملکەچی فەرمانی خودان ، ئایا دروستکردن وفەرمان کردن تەنها بۆ ئەو نییە ، پاك وبێگەردی وبەرزی بۆ پەروەردگاری جیهانیان .**

**پەروەردگار پەرستراوە بەڵگە خودا دەفەرموێت : ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان بپەرستن کە ئێوە وئەوانەی پێش ئێوەشی دروستکردووە بۆ ئەوەی لێی بترسن ، ئەو خودایەی کە زەوی بۆ ڕاخستوون وئاسمانی کردووە بە سەقفێك وبەسەرتانەوە ڕایگرتووە ، ولە ئاسمانەوە بارانی داباراندووە کە بە هۆیەوە بەروبوومی ڕوواندووە وکردوویەتیە ڕۆزیتان کەوابوو هاوبەش بۆ خودا بڕیارمەدەن لە کاتێکدا کە دەزانن .**

قالَ ابنُ كثيرٍ رحمَهُ اللهُ تعالى : الخالقُ لهذه الأشياء هو المستحقُّ للعبادة.
وأنواعُ العبادةِ التي أمرَ اللهُ بها : مثل الإسلامِ ، والإيمان ، والإحسان ؛ ومنه الدعاء ، والخوفُ ، والرجاء ، والتوكل ، والرغبةُ ، والرهبةُ ، والخشوع ، والخَشيةُ ، والإنابةُ ، والاستعانةُ ، والاستعاذةُ ، والاستغاثةُ ، والذَّبح ، والنذر ، وغيرُ ذلك من أنواع العبادة التي أَمرَ اللهُ بها كلُّها لله تعالى ، والدليل قوله تعالى : ﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ۝١٨﴾ .



ئیبن کثیر رحمه الله دەڵێت : دروستکەری ئەم شتانە شایستەی پەرستنە .
وجۆرەکانی پەرستن کە خودا فەرمانی پێکردووین وەك : ئیسلام ، وباوەڕ ، چاکەکاری ، وهەروەها پاڕانەوە ، وترسان ، وئومێد ، وپشت بەستن ، وڕەغبەت ، وترس وبیم ، وسەرکزی ، وترسی دڵ ، وگەڕانەوە وداوای یارمەتی کردن ، وپەنا پێگرتن ، وسەربڕین ، ونەزر ، جگە لەوانەش لە جۆرەکانی پەرستش کە خودا فەرمانی پێکردووە کە هەمووی بۆ خودا ئەنجام بدرێن بەڵگە خودا دەفەرموێت : ئەو ئەندامانەی جەستە کە سوژدەی پێدەبەن با تەنها لەبەر خودابێت وهیچ کەس مەکەنە هاوەڵی ولێیان مەپاڕێنەوە .

، فمَنْ صَرَفَ منها شيئًا لغيرِ الله فهو مُشرِكٌ كافرٌ ، والدليل قوله تَعَالَىٰ : ﴿ وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ١١٧ ﴾ (المؤمنون) ، وفي الحديث : ((الدُّعَاء مخُّ العبَادَة)) أخرجه الترمذي وضعفه الألباني ، والدليل قوله تعالى : ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ٦٠ ﴾ (غافر) .



هەركەس شتێك لەوانە بۆ جگە لە خودا ئەنجام بدات دەبێتە هاوەڵبڕیاردەر وكافردەبێت ، بەڵگەش ئەو ئایەتە كە خودا ﷻ دەفەرموێت : هەركەس هاوار بكاتە جگە لە خودا هیچ بەڵگەیەكی لەسەر ئەو بابەتە نییە ، ئەوە لێپرسینەوەی لای خودایە ، بە دڵنیاییەوە كەسی بێباوەڕ سەرفراز نابێت ، وله فەرموودەدا هاتووە دەفەرموێت : پاڕانەوە كرۆكی پەرستنە (أخرجه الترمذي وضعفه الألباني) ، بەڵگەش خودا دەفەرموێت : پەروەردگارتان فەرموویەتی لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە ، ئەو كەسانەی لە خۆباین ولە خودا ناپاڕێنەوە دەچنە دۆزەخەوە بە سەرشۆڕی وڕیسوایی .

ودليلُ الخوف قوله تعالى : ﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ١٧٥﴾(آل عمران) .

ودليلُ الرَّجاء قوله تعالى : ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ١١٠﴾(الكهف).

ودليل التَّوكُّلِ قوله تعالى : ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ٢٣﴾(المائدة) ، وقوله : ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ ٣﴾(الطلاق).



بەڵگە لەسەر ترسان ، خودا دەفەرموێت : لەوان مەترسن لە من بترسن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن .

بەڵگە لەسەر ئومێد ، خودا دەفەرموێت : هەرکەس ئومێد دەکات بگاتە دیداری پەروەردگاری با کردەوەی باش ئەنجام بدات ولە پەرستنی پەروەردگاریدا هیچ کەس نەکاتە هاوەڵی .

بەڵگە لەسەر پشت پێ بەستن ، خودا دەفەرموێت : پشت بە خودا ببەستن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن ، ودەفەرموێت : هەرکەس پشت بە خودا ببەستێت خودای بەسە .

 



ودليلُ الرَّغْبَة والرَّهبَة والخُشوعِ قولُه تعالى: ﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾(الأنبياء) .

ودليلُ الخَشية قوله تعالى: ﴿ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِي ﴿١٥٠﴾ ﴾(البقرة) .

ودليل الإنابة قوله تعالى : ﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ ﴿٥٤﴾ ﴾(الزمر).

ودليل الاستعانة قوله تعالى: ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴿٥﴾ ﴾(الفاتحة)

، وفي الحديث: ((إذَا استَعنتَ فَاستَعِن بالله))(أخرجه الترمذي وصححه الألباني).



وبەڵگە لەسەر ڕەغبەت ، وترس وبیم وترسانی دڵ ، خودا دەفەرموێت : ئەوانە کەسانێك بوون پێشبڕکێیان دەکرد لە ئەنجامدانی چاکەکان ولێمان دەپاڕانەوە بە ڕەغبەت وترس وبیمەوە ولێمان دەترسان .

وبەڵگەی ترسانی دڵ ، خودا دەفەرموێت : لەوان مەترسن ولە من بترسن.

وبەڵگەی گەڕانەوە ، خودا دەفەرموێت : بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان وملکەچ وفەرمانبەربین .

وبەڵگەی داوای یارمەتیکردن ، خودا دەفەرموێت : بە تەنها تۆ دەپەرستین وتەنهاش داوای یارمەتی لە تۆ دەکەین ، ولەو فەرموودەیە دەفەرموێت : ئەگەر داوای یارمەتیت کرد تەنها داوای یارمەتی لە خودا بکە .

ودليل الاستعاذة قوله تعالى : ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ۝١ ﴾ (الفلق) ، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ۝١ ﴾ (الناس) .

ودليل الاستغاثة قوله تعالى : ﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ ۝٩ ﴾ (الأنفال) .

ودليل الذَّبْحِ قوله تعالى: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۝١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ۝١٦٣ ﴾(الأنعام) ، ومِنَ السُّنَّة : ((لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لغَيْرِ الله))أخرجه مسلم .



وبەڵگەی پەناگرتن ، خودا دەفەرمویێت : بڵێ پەنا دەگرم بە پەروەردگار کە بەرەبەیان دەهێنێت ، وبڵێ پەنا دەگرم بە پەروەدگاری خەڵك .

وبەڵگە لەسەر داوای بە هاناوە چوون ، خودا دەفەرمویێت: کاتێك دەپاڕێنەوە کە خودا بە هاناتانەوە بێت وەڵامتان دەداتەوە .

وبەڵگە لەسەر سەر برین ، پەروەردگار دەفەرمویێت : بڵێ نوێژم وسەربڕین وژیان ومردنم بۆ خودای پەروەردگاری هەموو بوونەوەرە ، هیچ هاوەڵێکی نییە بەوە فەرمانم پێکراوە کە یەکەم کەسبم لە موسڵمانان ، ولە سوننەتدا هاتووە : نەفرەتی خودا لەو کەسەی بۆ جگە لە خودا سەر دەبڕێت .

ودليل النَّذْرِ قوله تعالى : ﴿ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ٧ ﴾ (الإنسان) .

الأصل الثَّاني : معرفةُ دين الإسلام بالأدلة ، وهو الاستسلامُ لله بالتوحيد ، والانقياد له بالطاعة ، والبراءة من الشّرك وأهله ؛ وهو ثلاثُ مراتبَ : الإسلامَ ، والإيمانُ ، والإحسانُ ، وكلُّ مرتبة لها أركانٌ.

فأركانُ الإسلامِ خمسةٌ: شهادةُ أنْ لا إله إلاّ اللهُ ، وأنَّ محمدًا رسولُ الله ، وإقام الصلاة ، وإيتاء الزكاة ، وصوم رمضانَ ، وحجُّ بيت الله الحرام .



وبەڵگەی نەزر ، خودا دەفەرموێت : وەفادارن بەو نەزرانەی کە بڕیاری دەدەن ، ودەترسن لە ڕۆژێك کە سزاکەی فراوان وبەربڵاوە .

بنچینەی دووەم : ناسینی ئاینی ئیسلامە بە بەڵگەوە ، کە بریتیە لە گوێڕایەڵبوون بۆ خودا بە تەنها پەرستنی ، وملکەچ بوونی خودا بە گوێڕایەڵی ، وخۆ بەریکردن لە هاوەڵبڕیاردان وئەوانەی هاوەڵ بڕیاردەدەن ، کە ئەوەش سیٚ پلەیە : ئیسلام ، وباوەڕ ، وچاکەکاری ، وهەر پلەیەك لەوانە کۆمەڵە بنچینەیەکی هەیە .

بنچینەکانی ئیسلام پێنجن : گەواهیدان کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق شایانی پەرستن بێت جگە لە خودا ، ومحمد پێغەمبەری خودایە ﷺ ، وئەنجامدانی نوێژەکان ، ودەرکردنی زەکات ، وڕۆژووی ڕەمەزان ، وحەجی ماڵی خودا .

فدليلُ الشّهادة قولُه تعالى : ﴿شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٨﴾(آل عمران) ، ومعناها لا معبودَ بحقّ إلا الله وحده ؛ (لا إله) نافيًا جميعَ ما يُعْبدُ منْ دون الله ، (إلا الله) مُثْبتًا العبادةً لله وحدَه لا شريكَ لهُ في عبادته ، كما أنَّه ليسَ له شرَيكَ في مُلْكه ، وتفسيرُها الذي يوضّحُها قولُه تعالى : ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ٢٦﴾



بەڵگە لەسەر گەواهیدان خودا دەفەرموێت : خودا گەواهیداوە کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە خودا ، وهەروەها فریشتەکان وزانایان ئەو گەواهییە دەدەن کە گەواهیدانێکی دادگەرانەیە ، هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە ئەو کە بە توانا ودانایەی کارلەجێیە ، کە مانای ئەوەیە هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە خودا بە تەنها ، (لا إله) نەفی هەموو ئەو شتانە دەکات کە جگە لە خودا دەپەرسترێن ، (إلا الله) ئەوە جێگیر دەکات کە پەرستن تەنها بۆ خودایە وهیچ هاوەڵێکی نییە لە پەرستنیدا ، وەك چۆن هاوەڵی نییە لە دەسەڵاتیدا ، وئەو تەفسیرەی کە ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئەو فەرموودەی پەروەردگارە : ئیبراهیم بە باوك وگەلەکەی گوت : من بەریم لەو شتانەی دەیانپەرستن ،

إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ
لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (الزخرف) .

وقوله تعالى:﴿ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا
نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ
ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾(آل عمران).

ودليلُ شهادة أنَّ محمداً رسولُ الله قولهُ تعالى : ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ
أَنفُسِكُمْ



**جگە لە خودا کە دروستی کردووم ، بە دڵنیاییەوە ڕێنمونیم دەکات ، وئەو وتەیەی کردە شتێکی بۆماوەیی لە نەوەکانی بۆ ئەوەی بە بەردەوامی بگەڕێنەوە سەری .**

**وئەوەی کە خودا دەفەرموێت : بڵێ ئەی خاوەن کتێبەکان وەرن لەسەر وشەیە ڕێك بکەوین کە هەموومان تەباین لەسەری ئەویش ئەوەیە جگە لە خودا نەپەرستین وهیچ شتێك نەکەین بە هاوەڵی ، وهەندێکمان ئەوانی تر نەکەین بە پەروەردگار جگە لە خودا ئەگەر ملکەچ نەبوون وپشتیان هەڵکرد بڵێن : ئێوە بە شاهیدبن ئێمە موسڵمانین وئەوەمان هەڵبژاردووە .**

**وبەڵگە لەسەر گەواهیدان لەسەر ئەوەی کە محمد پێغەمبەری خودایە ﷺ ، خودا دەفەرموێت : پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە لە نەفسی خۆتان**

عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ (التوبة) ، ومعنى شهادة أنَّ محمدًا رسولُ الله : طاعته فيما أَمر ، وتصديقُه فيما أَخْبر ، واجتناب ما عنه نَهى وزجر ، وأنْ لا يُعبدَ الله إلاَّ بما شرع.

ودليلُ الصلاة ، والزكاة ، وتفسيرُ التَّوحيد قولُه تعالى : ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾ (البينة) .



ئەوەی تووشی دەردەسەریتان بکات پێی ناخۆشە وسورە لەسەر هیدایەت وەرگرتنتان ، وبەسۆز وبەزەییە بەرامبەر باوەڕداران ، ومانای گەواهیدان ئەوەیە کە محمد پێغەمبەری خودایە : گوێڕایەڵیەتی لەوەی کە فەرمانی پێکردووە ، وبەڕاست دانانی ئەوەی کە هەواڵی لە بارەوەداوە ، ودوورکەوتنەوە لەوەی کە یاساغیکردووە ، وخودا پەرستی نەکرێت بەوە نەبێت بە شەریعەتی داناوە .

وبەڵگەی نوێژ وزەکات وڕاڤەی یەکخواپەرستی ، خودا دەفەرموێت : فەرمانیان پێنەکراوە بە تەنها پەرستنی خودا نەبێت بە دڵسۆزی ودووربوون لە هاوەڵبڕیاردان ، وبە ئەنجامدانی نوێژەکانیان ودەرکردنی زەکات ئەوەش ئاینی ڕاست ودروستە .




# سێ بنچینەکە وبەڵگەکانی ........... ٢٣

ودليل الصيام قولُه تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣﴾ (البقرة).

ودليل الحج قولُه تعالى : ﴿ فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ مَّقَامُ إِبۡرَٰهِيمَۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗاۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٩٧﴾ (آل عمران).

مرتبةُ الإيمان : الإيمانُ ، وهو بضع وسبعونَ شعبة ، فأعلاها قولُ لا إله إلاّ الله ، وأدناها إماطَةُ الأذَى عنِ الطريق، والحياء شعبةٌ من الإيمان، وأركانُه ستَّة :



بەڵگە لەسەر ڕۆژو ، خودا دەفەرمویٚت : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هیٚناوە ڕۆژووتان لەسەر پیٚویست کراوە وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پیٚش ئیٚوە پیٚویست کرابوو بۆ ئەوەی پاریٚزکاربن ولە خودا بترسن .

وبەڵگە لەسەر حەج ، خودا دەفەرمویٚت : خودا لەسەر خەڵکی داناوە حەجی ماڵەکەی بۆ هەر کەسیٚك کە لە توانایدا هەیە بگاتە مەککە ، هەرکەس بیٚباوەڕبیٚت ئەوە بە دڵنیاییەوە خودا بیٚ پیٚوستە لە هەموو دروستکراوەکانی .

پلەی باوەڕ : باوەڕ حەفتا وئەوەندە بەشە ، بەرزترین پلەی وتەی "لا إله إلا الله"یە ، ونزمترین پلەی لادانی شتی زیان بەخشە لەسەر ڕیٚگا ، و شەرم بەشیٚکە لە باوەڕ ، وپایەکانی شەشن :

أنْ تؤمن بالله ، وملائكته ، وكتبه ، ورُسُله ، واليوم الآخر ، وبالقَدَر خيره وشرّه ، والدليلُ على هٰذه الأركان الستَّة قولُه تعالى : ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ ﴿١٧٧﴾﴾(البقرة) ، ودليل القَدَرِ قوله تعالى: ﴿ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ (القمر) .

المرتبةُ الثالثةُ : الإحسانُ ، ركن واحدٌ ، وهو أنْ تعبدَ الله كأنَّك تَراهُ فإنْ لم تكن تَراهُ فإنَّه يراكَ ، والدليل قولُه تعالى : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾﴾(النحل) .



باوەڕ بە خودا هەبێت ، وبە فریشتەکانی ، وبە کتێبەکانی ، وبە پێغەمبەرەکانی ، وبە ڕۆژی دوایی ، وقەدەری خێر وشەڕ ، بەڵگەش لەسەر ئەو شەش پایە خودا دەفەرموێت : چاکەکاری ئەوە نییە کە ڕووت لە ڕۆژهەلات یان ڕۆژئاوا بکەیت ، بەڵکو چاکەکاری بریتییە لەوەی کەسێك باوەڕی بە خودا وڕۆژی دوایی ، وفریشتە ، وقورئان وپێغەمبەران هەبێت ، وبەڵگە لەسەر قەدەر خودا دەفەرموێت : ئێمە هەموو شتێکمان بە قەدەر دروستکردووە .

وپلەی سێیەم : چاکەکارییە ، یەك پایەی هەیە ، کە بریتییە لەوەی خودا بپەرستی وەك ئەوەی کە دەیبینی ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەوە بەڵنیاییەوە خودا تۆ دەبینێت ، بەڵگە خودا دەفەرموێت : خودای پەروەردگار لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە لە خودا دەترسن ، وهەروەها لەگەڵ چاکەکاراندایە .

وقولُه تعالى : ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ ﴾ (الشعراء) ، وقولُه تعالى : ﴿ وَمَا تَكُونُ فِى شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ﴿٦١﴾ ﴾ (يونس) الآية .

والدليل من السُّنَّة حديثُ جبريل المشهور عن عمر رَضي اللهُ عَنْهُ قال: بينما نحن جُلوسٌ عند رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّم ذات يوم ، إذا طلع علينا رجل شديدُ بياضِ الثياب ، شديد سواد الشَّعر ، لا يُرى عليه أثَر السَّفر ،



وخودا دەفەرموێت : پشت ببەستە بە خودای بە دەسەڵاتی بە بەزەیی ، کە دەتبینێت کاتێك بۆ نوێژ ڕاوەستاویت ، ودەتبینێت کە کاتێك کڕنوش وسوژدە دەبەیت لە نوێژدا ، بەدڵنیاییەوە خودا بیسەر وبینایە ، وخودا دەفەرموێت : ئەی پێغەمبەری خودا لە هەرچی بارێکدابیت یان قورئان بخوێنیت وهەرچی کردەوەیەك ئەنجام بدەن ئیلا ئێمە شاهیدین بەسەریەوە کاتێك دەست پێدەکەن .

بەڵگەش لە سوننەت فەرموودە باوەکەی جبریلە عليه السلام لە عومەرەوە رضي الله عنه ، فەرمووی کاتێك ئێمە ڕۆژێك لای پێغەمبەری خودا ﷺ دانیشتبووین ، لە ناکاو پیاوێك دەرکەوت ، جلێکی زۆر سپی لەبەر بوو ، وقژێکی زۆر ڕەشی هەبوو ، کاریگەری سەفەری پێوە دیار نەبوو ،

ولا يعرفه منَّا أحد ، حتّى جلس إلى النبي صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّم ، فاسند ركبتيه إلى ركبتيه ، ووضع كَفَّيْه على فخذيه ، وقال: يا مُحَمَّدُ ؛ أَخْبِرْنِي عَنِ الإسلام ، فقال رسولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْه وسَلَّم : ((الإِسْلاَمُ أن تَشْهَدَ أَن لا إِلَهَ إِلاَّ الله ، وأَنَّ مُحَمَّداً رسولُ الله ، وتُقِيمَ الصَلاَةَ ، وتُؤْتِي الزَّكَاةَ ، وتَصوم رمضَانَ ، وتَحُجَّ الْبَيْتَ إن اسْتَطَعْتَ إِلَيْه سَبِيلا)) ، قال : صَدَقْتَ ، فعجبنا له : يسأله ويُصَدِّقُه ! قال : فأخبرني عن الإيمان؟ قال: ((أَنْ تُؤْمنَ بالله ومَلاَئكَته وكُتُبه



وکەس لە ئێمە نەیدەناسی ، هەتا دانیشت لای پێغەمبەری خودا ﷺ ، هەردوو ئەژنۆی نابە ئەژنۆکانیەوە ، ودەستەکانی خستە سەر ڕانەکانی ، وفەرمووی : ئەی محمد ، هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئیسلام ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : ئیسلام بریتییە لەوەی گەواهی بدەیت کە هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە خودا ، ومحمد پێغەمبەری خودایە ، ونوێژەکانت ئەنجامبدەیت ، وزەکات بدەیت ، وڕۆژووی ڕەمەزان بگریت ، وحەجی ماڵی خودا بکەیت ئەگەر لە تواناتدا هەبوو ، فەرمووی : ڕاست دەفەرمووی ، سەرمان سوڕما چۆن پرسیار دەکات وبە ڕاستی دەخاتەوە! ، فەرمووی : هەواڵم بدەرێ دەربارەی باوەڕ ؟ فەرمووی : باوەڕ بە خودا وفریشتەکانی وکتێبەکانی

ورسله واليوم الآخر ، وتؤمن بالقدر خيره وشرّه)) ، قال : صدقت ، قال: فأخبرني عن الإحسان؟ قال : ((أن تعبد الله كأنّك تراه ، فإن لم تكن تراه فإنّه يراك)) ، قال: فأخبرني عن السّاعة ؟ قال : ((ما المسؤول عنها بأعلم من السّائل)) ، قال : فأخبرني عن أماراتها؟ قال : ((أن تلد الأمة ربّتها ، وأن ترى الحفاة العراة العالة رعاء الشّاء يتطاولون في البنيان)) ، قال : فمضى فلبثنا مليا ، فقال : ((يا عمر ، أتدري من السّائل؟)) قلت : الله ورسوله أعلم ، قال: ((فإنّه جبريل ، أتاكم يعلمكم دينكم)) أخرجه مسلم .



وپێغەمبەرەکانی وڕۆژی دوایی ، وبەقەدەری خێر وشەڕ ، فەرمووی : ڕاستت فەرموو ، فەرمووی هەواڵم بدەرێ دەربارەی چاکەکاری ؟ فەرمووی : خودا بپەرستی بەو شێوەیەی کە خودا دەبینی ، ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەوە بە دڵنیاییەوە خودا تۆ دەبینێت ، فەرمووی : هەواڵم بدەرێ دەربارەی قیامەت ؟ فەرمووی : پرسیار لێکراو زانستی دەربارەی لە پرسیارکەر زیاتر نییە ، فەرمووی : دەربارەی نیشانەکانی هەواڵم بدەرێ ، فەرمووی : کاتێك کەنیزەك ببێتە دایکی خاوەنەکەی ، وببینیت کەسانی پێ پەتی وڕەش وڕووتی شوانی مەڕومالآت کۆشك وتەلاری بەرز لێبدەن ، دەڵێت : ڕۆیشت ، وکاتێکی زۆر ماینەوە ، فەرمووی : ئەی عومەر دەزانی ئەو پرسیارکەرە کێ بوو ، گوتم : خودا وپێغەمبەرەکەی شارەزاترن ، فەرمووی : ئەوە جبریل بوو هاتبوو بۆ ئەوەی ئاینەکەتان فێربکات .

الأصل الثالث : معرفةُ نبيكُمْ محمد ﷺ : وهو محمدُ بنُ عبدِ اللهِ بنِ عبدِ المطلبِ بنِ هاشمٍ ، وهاشمٌ من قريشٍ ، وقريشٌ من العربِ ، والعربُ مِنْ ذرّيّة إسماعيلَ بنِ إبراهيم الخليلِ ، عليه وعلى نبيّنا أفضلُ الصَّلاة والسَّلام ، وله منَ العُمْرِ : ثلاثٌ وستُّونَ سنةً ، منها أربعون قبلَ النُّبُوَّة ، وثلاثٌ وعشرونَ نبيا رسولا ، نُبِّئَ بـ (اقرأ) وأُرْسِلَ بـ(المدّثر) ، وبلدُه مكّةَ ، بعثَهُ اللهُ بالنَّذارةِ عنِ الشّرك ، ويدعُو إلى التَّوحيدِ ، والدليلَ قوله تعالى :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ۝٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ۝٥ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ۝٦ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ۝٧ ﴾ (المدثر).



بنچینەی سێیەم : ناسینی پێغەمبەرەکەتان محمد ﷺ : محمدی کوڕی عبداللەی کوڕی عبدالمطلبی کوڕی هاشم ، کە هاشم لە هۆزی قوڕەیشە ، وقوڕەیش لە عەرەبە ، وعەرەب نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی خۆشەویستی خودایە ، لە تەمەنی شەست وسێ ساڵیدا وەفاتی کردووە ، چل ساڵی پێش پێغەمبەرایەتی بووە ، وبیست وسێ ساڵی ، وپێغەمبەری ڕەوانەکرابوو ، بە (اقرأ) وەحیی بۆ هاتووە ، بە (المدثر) فەرمانیی پێکراوە پەیامی خودا ﷻ بە خەڵك ڕابگەیەنێت ، خەڵکی شاری مەککەیە ، خودای پەروەردگار ناردوویەتی خەڵك ئاگاداربکاتەوە لە هاوەڵبڕیاردان ، وبانگەوازی خەڵك بکات بۆ تەنها پەرستنی خودا ، بەڵگە خودا دەفەرموێت : ئەی ئەو کەسەی خۆت داپۆشیوە ، هەستە خەڵك ئاگادار بکەرەوە ، وپەروەردگارت بە گەورە دابنێ وهیچ هاوەڵی بۆ بڕیارمەدە ، وجل وبەرگت پاك ڕابگرە ، ولە تاوان یان بتپەرستی بە دوور بە ، ومەبەخشە لەکاتێکدا چاوەڕوانی ئەوەبیت زیاتر لەوەی بەخشیوتە پێت ببەخشن ، ولەبەر پەروەردگارت ئارامبگرە .

ومعنى ﴿قُمْ فَأَنذِرْ﴾ يُنْذِرُ عن الشّرك ويدعُو إلى التَّوحيد ، ﴿وربَّكَ فكَبِّرْ﴾ أي : عَظّمْهُ بالتَّوحيد ، ﴿وَثيَابَكَ فطَهِّرْ﴾ أي: طَهِّرْ أعمالَكَ عن الشّرك ، ﴿والرُّجزَ فاهْجر﴾ الرُّجز: الأصنامَ ، وهجرُها تَرْكُها وأهلها ، والبراءة منها وأهلها.

أخذَ على هٰذا عشْرَ سنين يدعُو إلى التوحيد ، وبعدَ العشْرِ عُرِجَ به إلى السماء وفُرِضَتْ عليه الصلواتُ الخمس ، وصلَّى في مكّةَ ثلاثَ سنين ، وبعدَها أُمر بالهجرة إلى المدينة.

وصلَّى في مكّةَ ثلاثَ سنينَ ، وبعدَها أُمر بالهجرة إلى المدينة .



ماناى (قم فأنزر) ئەوەيە خەڵك ئاگادار بكاتەوە لە هاوەڵبڕياردان وبانگەواز بكات بۆ يەكتاپەرستى ، و(ربك فكبر) پەروەردگارت بە گەورەى دابنىٰ بە تەنها پەرستنى ، و(پيابك فگهر) واتە : كردەوەكانت لە هاوەڵبڕياردان پاكبكەرەوە ، و(الرجز فاهجر) الرجز : بتەكانە ، وفاهجر واتە : دووركەوتنەوە لە بتەكان وئەوانەشى دەيانپەرستن وخۆ بەريكردن لێيان .

بەو شێوەيە دە ساڵ مايەوە وبانگەوازى بۆ يەكتاپەرستى دەكرد ، دواى دەساڵەكە بەرزكرايەوە بۆ ئاسمان وپێنج نوێژەكەى لەسەر فەرزكرا ، لە مەككە سىٰ ساڵ نوێژى كرد ، دوايى ئەوە فەرمانى پێكرا كۆچ بكات بۆ مەدينە .

والهجرةُ : الانتقالُ منْ بلد الشّرك إلى بلد الإسلام ، والهجرةُ فَرِيضةٌ على هٰذه الأمّة منْ بَلَد الشّرك إلى بلد الإسلام ، وهي باقيةٌ إلى أنْ تقوم الساعةُ ، والدليل قوله تعالى : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾﴾(النساء).



كۆچ : گواستنەوەیە لە وڵاتی هاوەڵ بڕیاردەرانەوە بۆ وڵاتی موسڵمانان ، کۆچکردن فەرزە لەسەر ئەم ئوممەتە لەو وڵاتی هاوەڵبڕیاردەرانەوە بۆ وڵاتی موسڵمانان ، ودەمێنێتەوە هەتا هاتنی ڕۆژی قیامەت ، بەڵگە خودا دەفەرموێت : بەدڵنیاییەوە ئەو کەسانەی فریشتەی گیان کێشان گیانیان دەکێشت کە ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردووە ، پێیان دەڵێن ئێوە لە کوێبوون ، دەڵێن : ئێمە لاواز ونەتوانکاربووین لەسەر زەوی ، پێیان دەڵێن : مەگەر زەوی خودا فراوان وپان وبەرین نەبوو کە کۆچی تێدا بکەن ، ئەو کەسانە مەنزڵگەیان دۆزەخە کە خراپترین چارەنووسە ، ئەو کەسانە نەبێت کە لاواز ونەتوانکارن لە پیاوان وئافرەتان ومندالآن کە هیچ توانا ودەسەڵاتێکیان نییە وڕێگەچارەیەك پێنازانن ، ئەوانە خودا لێیان خۆش دەبێت خودای پەروەردگار لێبوردە ولێخۆشبووە وپۆشەری تاوانە .

، وقوله تعالى : ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ٥٦ ﴾ (العنكبوت) ، قالَ البغَوِيُّ رحمهُ الله : سببُ نزولِ هٰذه الآيةِ في المسلمين الذين بمكةَ لم يهاجروا ؛ ناداهُم اللهُ باسمِ الإيمان .

والدليلُ على الهجرة من السُّنَّة قولُه صلّى اللهُ علَيْه وسلّم : ((لا تَنْقَطِعُ الهجرةُ حتَّى تَنْقَطِعَ التَّوبةُ ولا تَنقطع التَّوبَةُ حتّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا)) أَخرجه أبوداود وصححه الألباني .

❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋

وخودا دەفەرموێت : ئەی بەندەکانم ئەوانەتان کە باوەڕتان هێناوە زەوی من فراوانە وپان وبەرینە بۆیە بە تەنها من بپەرستن ، البغوی رحمه الله دەڵێت : هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە بۆ ئەو موسڵمانانە بوو کە لە مەککە بوون کۆچیان نەکرد بوو ، خودای پەروەردگار بە ناوی باوەڕەوە بانگی کردن .

وبەڵگەش لە سوننەت لەسەر کۆچ ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خودایە ﷺ کە دەفەرموێت : کۆچکردن نابڕێتەوە تا تەوبەکردن کۆتایی نەیەت ، وتەوبەش کۆتایی نایەت هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیەت .

فلمَّا استقرَّ بالمدينة أُمر ببقيَّة شرائعِ الإسلام مثل الزكاة ، والصّوم ، والحجِ ، والأذان ، والجهاد ، والأمر بالمعروف والنهيِ عنِ المنكرِ وغيرِ ذلك من شرائعِ الإسلام .

أخذَ على هٰذا عشر سنين ، وبعدها توُفّيَ –صلوات الله وسلامُه عليه– ودينُه باقٍ ، وهٰذا دينه ، لا خيرَ إلاَّ دلَّ الأمَّةَ عليه ، ولا شرَّ إلاَّ حذَّرها منه.

والخيرُ الذي دلَّها عليه : التَّوحيدَ ، وجميعُ ما يُحبُّه اللهُ ويرضاهُ .



كاتێك لە مەدینە جێگیربوو فەرمانی پێکرا بە بەشەکانی تری شەریعەتی ئیسلام وەك : زەکات ، ڕۆژوو ، وحەج ، وبانگدان ، وجیهاد ، فەرمان بەچاکە ویاساغی کردنی خراپە وجگە لەوانەش لە فەرمانەکانی ئیسلام .

بەوشێوەیە دەساڵ مایەوە ، دوای ئەوە وەفاتی کرد درود وسەلامی خودای لەسەربێت ، ئاینەکە ماوەتەوە ، ئەمەش ئاینەکەیەتی ، هیچ خێر وچاکەیەك نییە ئیلا ڕێنمونی ئوممەتەکەی بۆ کردووە ، وهیچ شەڕ وخراپەیەکیش نییە ئیلا ئوممەتەکەی لیٚ ئاگادار کردووەتەوە .

ئەو خێرەی کە ڕێنمونی کردووە بە تەنها پەرستنی خودایە ، وهەموو ئەوەی خودا پێی خۆشە ولێی ڕازییە .

والشَّرُّ الذي حذَّرها منه : الشِّركُ وجميعُ ما يكرهُه اللهُ ويأباهُ .

بعثَهُ اللهُ إلى الناسِ كافّة ، وافترضَ طاعَتَه على جميعِ الثّقلين : الجنِ والإنسِ ، والدليل قولُه تعالى : ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴿١٥٨﴾ ﴾ (الأعراف) .

وكمَّل الله به الدين والدليل قوله تعالى: ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴿٣﴾ ﴾ (المائدة) .



وئەو شەڕ وخراپەی کە ئێمەی لێ ئاگادارکردووەتەوە : هاوەڵبڕیاردانە وهەموو ئەوەی خودا پێی ناخۆشە ولێی ناڕازییە .

خودا بۆ هەموو خەڵك ڕەوانەی کردووە ، وگوێڕایەڵی لەسەر جن ومرۆڤ فەرزکردووە ، بەڵگە خودای پەروەردگار دەفەرموێت : بڵێ ئەی خەڵکینە من پێغەمبەری خودام بۆ هەمووتان ڕەوانە کراوم .

وخودا ئاینی بە هۆی ئەوەوە تەواوکردووە بەڵگە خودا دەفەرموێت : ئەمڕۆ ئاینەکەم بۆ کامڵکردن ونیعمەتەکەم بۆتان تەواوکرد ، وڕازیبووم ئیسلام ئاینتان بێت .

والدليلُ على موته صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم قولُهُ تعالى : ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ۝٣٠ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ۝٣١ ﴾ (الزمر) .

والناس إذَا ماتُوا يبعثُونَ ، والدليل قولُه تعالى : ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ۝٥٥ ﴾ (طه) ، وقولُه تعالى : ﴿ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ۝١٧ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ۝١٨ ﴾ (نوح) .

وبعدَ البعْث محاسبُونَ ومجزيُّونَ بأعْمالهمْ والدليلُ قولُهُ تعالى :﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى ۝٣١ ﴾ (النجم) .



بەڵگە لەسەر ئەوەی کە وەفاتی کردووە ﷺ خودا دەفەرمویٚت : تۆ دەمریت وئەوانیش دەمرن ، پاشان ئیٚوە لای پەروەردگارتان کیٚشە وگیروگرفتەکانتان یەکلایی دەکریٚنەوە ، وخەڵك ئەگەر مردن زیندوو دەکریٚنەوە ، بەڵگە خودا دەفەرمویٚت : ئیٚمە لە خاك دروستمانکردوون ودەتان گەڕیٚنینەوە بۆ خاك وپاشان لە خاکەوە دەرتان دەهیٚنینەوە ، وخودا دەفەرمویٚت : خودا لە خاك ئیٚوەی دروست کردووە پاشان دەتان گەڕیٚننەوە بۆ خاك ، وپاشان زیندووتان دەکاتەوە.

دوای زیندووبوونەوەش لیٚپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکریٚت وپاداشت دەدریٚنەوە بەو کردەوانەی ئەنجامیان داوە ، بەڵگە خودا دەفەرمویٚت : هەموو ئەوەی لە ئاسمانەکان وزەویدا هەیە موڵکی خودای پەروەردگارە ، بۆ ئەوەی پاداشتی خراپەکاران بداتەوە بەکردەوەکانیان ، وپاداشتی چاکەکارانیش بداتەوە بە باشترین شیٚوە .

ومَنْ كذَّبَ بالبعث كَفرَ ، والدليل قولُهَ تعالى : ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧ ﴾(التغابن) .

وأرسلَ اللهُ جميعَ الرُّسلِ مبشّرينَ ومُنذرين ، والدليل قولُهُ تعالى : ﴿ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ١٦٥ ﴾ (النساء) ، وأولُهُمْ نوحٌ عليه السلامُ ، وآخرُهُم محمدٌ ﷺ وهو خاتمَ النَّبيين والدليلَ على أنَّ أوَّلهُم نوح قوله تعالى : ﴿ ۞إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ ١٦٣ ﴾ (النساء) ،



ئەوەی باوەڕی بە زیندووبوونەوە نەبێت کافر دەبێت ، بەڵگە خودا دەفەرموێت : ئەوانەی کافرن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە زیندوو نابنەوە ، پێیان بڵێ : بەڵی سوێند بە پەروەردگار زیندوو دەکرێنەوە وپاشان هەواڵتان پێدەدرێت دەربارەی ئەو کردەوانەی ئەنجامتانداوە ، ئەوەش لای خودا ئاسانە .

خودا هەموو پێغەمبەرانی ناردووە کە مژدەدەر وترسێنەربن ، بەڵگە خودا دەفەرموێت : پێغەمبەرانێك کە مژدەدەر وترسێنەرن بۆ ئەوەی خەڵك بەڵگەیان بە دەستەوە نەبێت لای خودا دوای ناردنی پێغەمبەران ، یەکەمیان نوح علیه السلامە وە کۆتایان محمدە صلی الله علیه وسلم ، بەڵگە لەسەر ئەوە یەکەمیان نوحە خودا دەفەرموێت : ئێمە وەحیمان بۆ کردوویت وەك چۆن وەحیمان بۆ نوح وپێغەمبەرانی دوای ئەویش کردووە .

وكلُّ أمَّة بعثَ اللهُ إليها رسولاً من نوحٍ إلى محمد يأمُرُهُم بعبادة الله وحدَهُ ، وينهاهم عن عبادة الطاغوت ، والدّليل قولُه تعالى : ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ﴾(النحل) ، وافترض الله على جميعِ العباد الكفر بالطاغوت والإيمانَ بالله ، قال ابنُ القيّم رحمهُ الله تعالى : معنى الطاغوت ما تجاوزَ به العَبدُ حدَّه من معَبود ، أو متبوعٍ ، أَو مطاع .



وهەموو ئوممەتێك كە خودا پێغەمبەری بۆ ڕەوانەكردووە لە نوحە وە تا محمد فەرمانیان پێدەكات بە تەنها پەرستنی خودا ، وەیاساغی پەرستنی تاغوتەكانی لێدەكات ، بەڵگە خودا دەفەرموێت : بەدڵنیاییەوە بۆ هەموو ئومەتێك پێغەمبەرمان ڕەوانە كردووە ، بۆ ئەوەی خودا بپەرستن ولە تاغوتەكان دووركەونەوە .

وخودا فەرزی كردووە لەسەر هەموو بەندەكان كە كوفر بكەن بە تاغوتەكان وباوەڕ بە خودا بهێنن ، ئیبن القیم رحمه الله ﵀ دەڵێت : مانای تاغوت ئەوەیە بەندە سنور ببەزێنێت بەرامبەر پەرستراو یان ئەو كەسەی شوێنیكەوتووە یان ئەو كەسەی گوێڕایەڵی دەكات .

والطواغيت كثيرونَ ورؤوسهم خمسةٌ : إبليس لعنه الله ، ومَنْ عُبِدَ وهو راضٍ ، ومن دعا الناس إلى عبادة نفسه ، ومن ادَّعى شيئًا من علم الغيب ، ومن حكم بغير ما أنزل اللهُ ، والدليل قولُه تعالى : ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ﴾ (البقرة) ، وهٰذا هو معنى (لا إله إلا الله) ، وفي الحديث : ((رأس الأمرِ الإسلام وعمودُه الصَّلاةُ وذروةُ سنامه الجهادُ في سبيلِ الله )) أخرجه الترمذي وابن ماجه وصححه الألباني ، والله أعلم ، تَمَّتْ هٰذه الرسالَةَ.



تاغوتەکان زۆرن وسەرکردەکانیان پێنجن : ئیبلیس نەفرەتی خودای لێبێت ، وهەرکەس بپەرسترێت وخۆی ڕازی بێت ، وهەرکەس خەڵك بانگ بکات بۆ پەرستنی خۆی ، وهەرکەس بانگەشەی زانینی شتێك بکات لە پەنهان ، وهەرکەس حوکم بکات بە جگە لەوەی خودا دایبەزاندووە ، بەڵگە خودا دەفەرموێت : زۆرکردن لە ئاینی ئیسلامدا نییە بۆ ئەوەی کەسێك موسڵمان بێت ، ڕێگەی هیدایەت وڕێگەی گومڕایی ڕوون بووەتەوە هەرکەس کفر بە تاغوت بکات وباوەڕ بەخودا بهێنێت ، ئەوا دەستی بە پەتی بەهێزە گرتووە کە ئاینی ئیسلامە کە هەرگیز پچڕانی بۆ نییە خودا بیسەر وبینایە ، ئەوەش مانای "لا إله إلا الله"یە ، ولە فەرموودەدا دەفەرموێت : سەری کارەکە ئیسلامە ، ونوێژ کۆڵەکەیەتی ، وجیهاد لوتکەکەی تێکۆشانە لە پێناوی خودای پەروەردگار ، خودا زاناترە ، ئەم نامیلکەیە تەواو بوو .